


Ministry of Health



# هیوا - کیمۆ و خانە خراپەکان



## هیوا - کیمۆ و چیرۆکی ڕاوکردنی خانە شێرپەنجەییەکان

وەرگێران و ئامادەکردنی

گوڵاڵە پشدەری

بەسەرداچوونەوە

د. هیوا یاسین حەمە حاجی

د. ئاری دەروێش عبداللە

2013

# هیوا- کیمۆ و خانه خراپەکان

هیوا- کیمۆ و چیرۆکی ڕاوکردنی خانه شێرپەنجەییەکان

وەرگێڕان و ئامادەکردنی
**گوڵاڵەی پشدەری**



بەسەرداچوونەوە
**دکتۆر هیوا یاسین حەمە حاجی**
**دکتۆر ئاری درویش عبدالرحمن**

**چاپ و بڵاوکردنەوەی**
**ڕاگەیاندنی وەزارەتی تەندروستی**
**بە هەماهەنگی سەنتەری پەنا**

٢٠١٣

رۆژباش...

ئێستا چیرۆکێکت بۆ دەگێڕمەوە، چیرۆکی هیوا کیمۆ و گەرانی بە دوایی دۆزینەوەیی خانەخراپەکانی شێرپەنجەیی.

لە پێشاندا دەبێت بۆت ڕوون بکەمەوە کە خانە چییە.هاوکات تۆ دەتوانی تەماشایی وێنەکان بکەی.

سەیربکە، من وێنەیەکی تۆم کێشاوە.



وابزانە کە جەستەی تۆ خانوویەکی بچکۆلەیە. پێست هەموو دەورووبەری جەستەتی داپۆشیوە.

لە پشت پێستتداچەندین ژوور و ڕێگەی لێیە وەکو ماڵ یان خانوون.

ئەو ژوورەی کە خۆراکی بۆ دەچێت،ئەوا گەدەی تۆیە.ئەو ژوورە بچکۆلەی کە خوێنی بۆ دەچێت و لەوێدا خوێن پاڵێوەدەنرێت بۆ بەشەکانی جەستە ئەوە دڵی تۆیە.خوێن بە ڕێگەی بۆڕییەکان یان لوولەکانی خوێندا هاتووچۆ دەکات.ئەوانە پێیان دەڵێن خوێنبەر- خوێن هێنەرەکان.

ئەڵبەتە،تۆ ناتوانی تەماشایی ناو جەستەی خۆت بکەی،بەڵام دەتوانی گوێت لێ بێت و ببیستی کە چی ڕووی ئەدات لەناو جەستەتدا.

دەستت لە سەر سینگت دابنێ،ئەنجا گوێت لە لێدانی دڵت دەبێت. یان جاریوایە،ئەگەر برسیت بێت،گوێت لە خورەخوڕی گەدە دەبێت.



دیوارەکانی خانوو پێکهاتوون لە بەرد یان بلۆک و پێستی تۆ لە خانەکان.
هەموو شتێک لە جەستەی تۆدا لە خانە پێک هاتووە:پێستت لە خانەی پێست، مووەکان لە خانەی موو و خوێن لە خانەی خوێن.
خانەکان ئەوەندە بچووکن کە ئەوان بە چاوی ڕووت نابینی.من وێنەی چەند خانەم بۆ کێشاوی،بۆ ئەوەی بزانی ئەوان چۆنن. دەتوانی خانەی موو بناسییەوە؟
تۆ خانەکان ناتوانی ببینی،ئینجا ئاسان نییە، لەوە تێبگەی.
وابیربکەوە کە خانەکانی پێستی تۆ وا لەیەکتر نزیک و بەسەر یەکتردا پاڵییان داوەتەوە ڕێک وەکو بلۆکەکانی دیواری خانوو.
خانەکانی خوێن لە ناو بۆڕییەکانی خوێندا مەلە دەکەن و دەگەڕێن، ئەگەر شوێنێکت بریندا بوو،ئەوە خوێنی لێدێتە دەرەوە،خۆ ئەوە یان دەزانی.
لەو وێنەدا دەبینی کە خانەکان کێشەیان نییە. ئەوان شادن،لە گەڵ یەکتر پێکەوەبە خۆشی دەژین و پێکەوە و لە نێوانیاندا گرفت بۆ یەکتر درووست ناکەن.



ئینجا هەموو جارێک، چەند خانەی نوێ دێنە ناویان،دەیبینی؟

پێشان خانەی بچووکن و لە دواییدا گەورە دەبن و ئەانیش خانەی بچووکتر دیسان درووست دەکەن.

بە ڕاستی تۆ لە بەر ئەوە یە کە گەورە دەبی چۆنکە بەردەوام خانەی نوێ درووست دەبن.

وە قژت درێژ دەبێت چۆنکە خانەکان مووی تۆ خانەی بچووکی- خانەی موو درووست دەکەن.

جاریوایە خانەیەک لە نیوانیاندا،بەدکار و خراپە.



ئەو خانەکانی تر ئازار ئەدات و کاری توونـد و تیژ بەرامبەر بە خانەکانی تر دەکات و دەیەویت لەویدابە تەنیا خۆی بژیت.ئەو مافی ژیان بە ئەوانەی تر نادات ودەیەویت هەموو شوینەکە بۆ خۆی داگیر بکات.

ئەو جۆرە خانە پێی دەڵێین خانەی شیرپەنجەیی.دەبینی چەند خراپە!



خانە باشەکان زۆر توورەن لە خانە خراپەکان واتە لەخانە شێرپەنجەییەکان.چۆنکە ئەو خانە خراپانە خانەکانی باش پاڵ پێوەدەنێن بۆ لایەک و ئازارییان ئەدەن.

خانە خراپەکان ڕەچاوی بەرژەوەندی ئەوانەی تر ناکەن و هیچ بۆیان گرنگ نییە کە خانەباشەکان چییان بەسەر دێت و چۆن ئازار دەکێشن.ئەوان خۆپەرستن وە تەنیا خەمی خۆیانە.

لەوەش خراپتر وناخۆشتر ئەوەیە کە خانە خراپەکان دیسان خانەی تری خراپ درووست دەکەن.

ئینجا ئەو خانە بچووک و نوێیانە بە هەمان شێوە بە دکارن و گرفت درووست ئەکەن.



خانــە خراپــەکان زۆریــش زوو کۆمــەڵێک پێــک دێــن وە ڕیژەکەیان زیاد دە بێت.

ئــەوان بــە ئــارامی و بــە خۆشــی پێکــەوە کــۆ دەبنــەوە وە گلۆلەیــەک پێکدێنن وە ڕێگــەنادەن خانــە باشــەکان لێیــان نزیک ببنەوە.

خانە باشــەکان بــەو بــارە زۆر دڵنیگەران وە لێیان پەستن چۆنکە ناتوانن هێچییان لە گەڵدا بکەن.

جاریوایــە کــە ئــەو گلۆلــە یــان تۆپــە خڕۆکــە کــە لــە خانــە خراپــەکان درووســت بووە،ئەوەنــدە گــەورە دەبێــت کــە

دەبێت دکتۆر ئەوە دەربێنێت.ئەوە بە ڕێگەی نەشتەرگەری دەبێت.

خۆشبەختانە خانەکانی خوێن ئامێر یان چەکی تایبەتییان پێیە.بەو ئامێر یان چەکە دەتوانن ئەو خانە خراپانەی شێرپەنجەیی بکوژن.

سەیری ئەو وێنەیە بکە و ببینە کە چۆن دەیکوژێت.



ئەگەر خانەکانی خراپ کوژران،ئەوە خانە باشەکان دڵخۆشن.

بەڵام جاریوایە خانەکانی خوێن ناتوانن خانە خراپەکان بکوژن. ئینجا پێویست بە هاوکاری و چارەسەرییە.
ئەو هاوکاری و چارەیە لە لایەن هیوا کیمۆیەوە دێت.
هیوا- کیمۆ کێیە؟ ئەوەی ئێستا دەیخوێنینەوە چیرۆکی ئەوە و باش گوێ بگرە....



هیــوا- کیمــۆ لــە نەخۆشــخانە دەژیــت. ئــەو لــە نــاو شووشـەیەکدا مەلـە دەکـات و لـە گـەڵ هاوڕێکـانی وەکـو هەژار-کیمـۆ ،هـیمن-کیمۆ،هـەردی-کیمۆ،هێدی-کیمۆ،هـادی-کیمۆ و زۆر لە هاوڕێیانی تر.

رۆژێــک لــە ڕۆژان دکتــۆر دێتــە لای هیــوا- کیمــۆ و دەڵێت:"لـەو ژوورەدا هاوکـاری تـۆم پێویسـتە.ئەو کـوڕە بچکۆلـە یارمـەتی هێزی تـۆ و هاوڕێکـانتی دەوێت.چۆنکـە ئەوکوڕە ڕێژەیەکی زۆر لە خانەی خراپی شێرپەنجەیی لـە جەستەیدا کـۆ بۆتەوە.خانـەکانی خـوێن ئـەوە شـەو و ڕۆژ خـەریکن و هـەوڵ ئـەدەن ئـەوان بکوژن،بـەڵام سـوودی نییەو بە تەنیا پێیان ناوێرن. "

"زۆر باشـــە."وەڵام ئەداتەوە هیوا-کیمۆ، ئێمــەش ئامــادەیین بــۆ هاوکــاری.دەی وەرن کوڕینە،با هەر ئێستا دەست بـەکار بین."



دکتـۆر ســرنجێک هەڵـدەگرێت و بـە گـوێرەی پێویسـت هەنــدێک لــەو کــورە کیمزیانــە ڕایاندەکێشــێتە نــاو ســرنجەکە.لەناو ســـرنجەکەدا هەراوهزریایـــەکیان گرتۆتەوە.چۆنکە هەرکامێکیان دەیانەوێت یەکەم کەس بن کە خۆیان دەگەیەنن بە کورە بچکۆلەکە تا یارمەتی بدەن.



کورە بچکۆلەکە لە ناو جێگەدا ڕاکشاوە وچاوەڕێی دکتۆر دەکات.ئەو ناوی ئارامە.

ئــارام لێفەکــەی تــا لــووتی بەســەر دەم و چــاوی داداوە.هەندێک ترس وەدڵەڕاوکێی هەیە.

ئارام ئەو کورە کیمۆ یانە لە ناو سرنجەکەدا ناتونیت ببینیت چونکە ئەوان زۆر زۆر وور و بچووکن ئەوەندە بچووک وەکو خانەکان.

دکتور زۆر بە هێواشی دەرزی سرنجەکە لە ناو بۆری خوێنی ئارام ڕادەکات و هەموو کورە کیمۆکان لە ناو بۆری خوێنی ناو دەستی ئارام دەرژێنیت.هەر کە هیوا کیمۆ گەیشتە ناو خوین،بە خێرایی ڕادەکات تاکو پییە بچکۆلەکانی هێزیان تێدابێت وە یەکەم کەسە کە خۆی دەگەیەنێتە جێگەی مەبەست و ئینجا خانە باشەکانی تر هاوار دەکەن و دەڵێن:

"ئەی خوایە گیان چەند باش بوو هاتن،یارمەتیمان بدەن تا خانە خراپەکانی شێرپەنجەیی پێکەوە بگرین و بیان کوژین و ئارام ڕزگار بکەیین ."

خانەکانی خراپ دەترسێن و هەوڵ ئەدەن خۆیان بشارنەوە یان ڕابکەن.



بەڵام خانە باشەکان بە ڕیز ڕادەوەستن و ڕێیان لێ دەگرن تاکو ئەوان نەتوانن ڕابکەن.

هیوا-کیمۆ و هاوڕێکانی یەک بە یەک خانە خراپەکان یان خانە شێرپەنجەییەکان قووت ئەدەن و دەیانخۆن.
خانەکانی باش شادومانن و قاقای پێکەنینیانە! کوڕە کیمۆکان بە ئازایەنە بەردەوامن لە شەڕکردن دژ بە خانە شێرپەنجەییەکان واتە خانە خراپەکان.



بەڵام ...یەک کێشە یان گرفتێک هەیە. کوڕە کیمۆکان هێزی چاو یان بینینیان لاوازە. ئینجا خۆ تۆش بینیتن کە ئەوان چاویلکەیان لە چاودابوو.بەو شێوەیە ئەوان دەتوانن خانە خراپەکان باشتر ببینن و بیانناسنەوە.
جاروایە کوڕە کیمۆکان ئەوەندە بە خێرایی ڕادەکەن کە بە سەر پێی خۆیاندا هەڵ دەخلیسکێن وە دەکەون.ئینجا

ئـەوان لـەو کاتـەدا چاویلکەکـەیان لـێ بـەر دەبێتـەوە و نایدۆزنەوە.بـەو هۆیـەوە ئـەوان بـە هەڵـە چەنـد خانەیـەکی باش لە خانەکانی ئارام قووت ئەدەن.
تەماشـا بکـە چـی لـێ هـاتووە! کـوڕە کیمۆکـان خانـەکانی مووی ئارام یان تێکداوە.



لەو وێنەدا دەیبینی کە چۆن ئارام قژی هەر لە خزیەوە هەڵدەوەرێت.ئارام زۆر لای سەیرە.بەڕاستی کە هەستێکی زۆر ناخۆش و سەیرە کە لە ناکاو قژت هەڵوەرێت.
خۆشبەختانە لە دوائیدا ئەو خانە موورانە(قژە) کە ماونەتەوە،دیسان بێچوو درووست دەکەن وە قژی ئارام سەر لە نوێ دەڕوێتەوە.



32

هەندێک لە کوڕە کیمۆ کان کە لە ناو گەدەی ئارام دا سەرقاڵی کار بوون،بە هەڵە لە وێدا هەندێک خانەی گەدەیان تێکداوە.

زۆر ناخۆشە کە خانەکانی گەدە هێرش دەبەن،ئینجا بۆیە ئارام دڵی تێکەڵ دێت و دەست بە ئێلنجدان دەکات و دەرشێتەوە.



خانە خراپەکان نەمان و لەناو چوون و کورە کیمۆکان ماندوو بوون بەڵام ڕازین لە کارەکەیان.

ئەوان کە کارەکەیان تەوا کرد ئینجا لە جەستەی ئارام دەڕۆنە دەرەوە.

کەس نازانێت بۆ کوێ دەڕۆن.لەوانەیە بۆ وڵاتی کیمۆ،لەو شوێنەی کە دیسان کورەکانی کیمۆیی دروست دەبنەوە.

جاریوایە چەندێک لەو خانە خراپانە خۆیان لە شوێنێکدا بە شێوەیەک بشارنەوەکە کورەکانی کیمۆیی نەیان دۆزنەوە.

لەو وێنەیەدا دەتوانی خانەی خراپ بدۆزییەوە؟

چۆنکە خانەکانی شێرپەنجەیی واتە خراپەکان ئەوندە بە باشی دەتوانن خۆیان بشارنەوە،ئینجا بۆیە ئارام دەبێت زۆر جار سەردانی نەخۆشخانە بکات و دکتۆر بیبینێت تاکو دڵنیا دەبن کە هەموو خانە شێرپەنجەییەکان واتە خراپەکان لە ناو جەستەیدا نەماون و لە ناو چوون.



چیرۆکی هیوا-کیمۆت پێ خۆش بوو؟

بەڵێ؟؟

دەی چاوەکانت دابخە.هیوا کیمۆ دەبینی؟ئەو دەبینی لە گەڵ هاوڕێکانی هەژار-کیمۆ،هێمن-کیمۆ،هێدی،هە ردی-کیمۆ وهادی-کیمۆ؟ دەیانبینی کە ئەوان لە گەڵ خانەکانی خوێنی تۆ پێکەوە

شەڕی دژ بە خانەکانی شێرپەنجە واتە خانە خراپەکان دەکەن و تێکیان دەشکێنن و سەرکەوتن بەدەست دێنن؟

ئامادە و پێشکەشکردنی سەنتەری پەنا بۆ پشتیوانی لە تووشبووان بە شێرپەنجە وڕاگەیاندنی وەزارەتی تەندروستی هەرێمی کوردستانە.

سوپاس بۆ:
ئەرکی بەسەرداچوونەوەی ناوەڕۆکی ئەم نامیلکە، پسپۆری شێرپەنجە و هیماتۆلۆج
دکتۆر هیوا یاسین حەمە حاجی و دکتۆر ئاری دروێش عبدالرحمن.

**ئەم چیرۆکە لە بیرۆکەی خاتو هێلە موتزفێڵد Helle Motzfeldt، دەروونناسی دانیمارکی هاتووە.**